جیابوون بەڵگەیە لەسەر نەمانو لێك جیابوونەوە بەبەڵگەی ئەم ئایەتە: ﴿حَتَّىٰ إِذَا أَخَذَتِ الأَرْضُ زُخْرُفَهَا﴾(یونس:٢٤).

*هەروەها دەڵێن: كارێك تەواوبوو یەكیگرتەوە نەمانی دێ بەپیرتەوە.

(نابلسی) دەڵێت: یەككرتنەوەی خۆشەویستان لەخەودا بەڵگەیە لەسەر هاوسەر.

*ئەگەر بینی لەگەڵ منداڵێكدا دانیشتوەو خۆشی دەوێت هاوسەردەرگرێ، ژنیش بەهەمان شێوەیە ئەگەر بینی لەگەڵ ئازیزێكدا دانیشتوە شوودەكات بەپیاوێكو لەنێوانیاندا خۆشەویستیو تەبایی بڵاودەبێتەوە.

*ئەگەر بینی یەكیگرتەوەو توانی زاڵبێت بەسەر ئاستەنگەكانی دنیادا حاڵو باری دەگۆڕێو كەمێك شاددەبێت.

*ئەگەر خۆشەویستەكەی سەردانیكرد تووشی خۆشیو شادیدەبێت.

**یەكێتی(تەبایی)**: (ئیبن سیرین) دەڵێت: یەكێتی لەخەودا ملكەچیو رسوایيو هەژاریو لابردنی دەستەڵاتدارە.

(نابلسی)دەڵێت: لەخەودا تاككەوتنی كەسێكە لەو پیشەو رایەی هەیەتی.

*ئەگەر فەرمانڕەواو پادشایەك بینی بەتەنیاییە بەبێ وەزیرو كەسێك لەگەڵیدابنیشێ یان كەس وەڵامی ناداتەوە یان پیاوێكی گشتی خەڵكییەو هەژار دەكەوێ یاخود خۆشەویستەكەی بەجێیدەهێڵێ.

# پێڕستی پیت‌و وشەکان